منتدى إقرأ الثقافي
WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ئاگادار كردنەوەی

# بەندەی خاوەن توێژ

# لە

# جوولاندنی پەنجە لەناو نوێژ

دانانی

الشيخ حسن بن علي السقاف
القرشي الهاشمي الحسيني الشافعي

وەرگێڕانی

عبدالشهيد عثمان

بسم الله الرحمن الرحيم

**الحمد لله رب العالمين، والصلاة والسلام على سيد المرسلين وعلى آلهِ وصحبه أجمعين، أمّا بعد:**

ئەم کتێبە دانراوی مامۆستای بەڕێزو زانای گەورە (الشيخ حسن بن علي السقاف)ە، خوا سەرکەوتووی بکات، دەربارەی سەلماندنی ئەوەی کە پەنجە جوولاندن لەناو تەحیاتی نوێژ سوننەتی پێغەمبەر نییەو، ئەو بەڵگانەی کە (ئەلبانی) هێناویەتیەوە هەمووی ڕەت کردۆتەوە بە شێوازێکی زۆر جوانو ڕێکو پێك، منیش بۆ ئەوەی گەلی کوردی

خۆشەویستم بەم کارە چاكو پاکە شاد بکەم، ناوی خوام لیٚ هێناو دەستم پیٚ کرد بە وەرگێڕانی بۆ زمانی شیرینی کوردی، لەهەر جێگایەك قسەی خۆم لەناو کردبیٚ ئەوا لە سەرەتاکەی دەڵێم (وتم)و لە کۆتاییەکەی قسەکەم دەڵێم (تەواو بوو)، لە خوای گەورە داواکارم کە ئەم کارەم قبووڵ بکاو لە منو دایكو و باوكو مامۆستاو خۆشەویستانم خۆش ببیٚ... آمین.

لەدوای سوپاسو ستایش کردنی خوای گەورەو ناردنی دروودو رەحمەت بۆ گیانی پاکی پێغەمبەرﷺ، شێخ (سَقّاف) دەفەرمویٚ:

بزانە: -خوای گەورە منو تۆ سەرکەوتوو بکا- چەند برایەکی خۆشەویست داوایان لیٚ کردم کە باسێك بنووسم لەسەر مەسەلەی (جوولاندنی پەنجە لەناو

تەحیاتی نوێـژ)، وە ئایا سـوننەتە نوێژکـەر بـەردەوام پەنجەی شادەی خۆی بجوولێنێ لە تەحیات هـەروەکو چەند کەسێك وا دەیکەن کە دەعوای ئەمە دەکـەن کـە لەسەر –زانست– و سوننەتی پێغەمبەرﷺ دەڕۆن، یان مەکرووهە وا بکەن، یان حەڕامـە؟ وە ئایـا نوێـژی پـێ بەتاڵ دەبێ یان نا؟ لەگەڵ ئەمەشدا دەبـێ بزانـین کـە ئـەلبانی لـە کتێـبی (صفـة صـلاة النـــبي) دەڵـێ: کـە سوننەتە پەنجەی خۆت بجوولێنی تا سەلام دانـەوە لـە نوێژ.

ئێسـتاش کـاتی ئـەوە داهـاتووە کـە دەسـت بـە وەڵامی ئەم پرسیارە بکەین، بە لێکۆڵینەوەیەکی وا کە نەئـەوەندە کـورت بـێ بـە ئـەنجامت نەگەیـەنێ، وە نەئەوەندە درێژ بـێ کـە سـەرت بێشـێنێ، هـەر خـوای گەورەشە یارمەتیدەرەو، کورتـەی وەڵامدانـەوەی ئـەم

مەسەلەیە، دەڵێم: بزانە، ئیمامی (نووي) ڕەحمەتی خوای لێ بێ پرسیاری لێ کرا دەربارەی جوولاندنی پەنجە لەناو نوێژ، پرسیارەکەش ئەمە بوو[1]: ئایا سوننەتە لە تەحیاتدا پەنجەی شادە ئیشارەتی پێ بکەن؟ وە کەی بەرزی ئەکەیەوە بۆ ئاماژە پێ کردن؟ وە ئایا جوولاندنی پەنجە نوێژ بەتاڵ دەکا.....؟

ئەویش وەڵامی داوەو فەرمووی: سوننەتە. ئاماژە بە پەنجەی شادە بکەی لەکاتی وتنی (إلاّ الله)[2] یەك جارو نەیجوولێنی[3]،

---

(١) لە کتێبی (فتاوی الإمام النووي)- لاپەڕە (٣٤).

(٢) بەڵگەکەشی ئەوەیە کە حەزرەتی (ابن عمر) ڕەزای خوا لە هەردووکیان بێ دەفەرموێ: (پێغەمبەرﷺ کاتێ بۆ تەحیات خوێندن دائەنیشت دەستی ڕاستەی لەسەر ڕانی دائەناو هەموو پەنجەکانی ئەنوقاند تەنیا پەنجەی شادە نەبێ ئاماژەی پێ ئەکرد، وە دەستی چەپەی لەسەر ڕانی چەپەی دائەنا).

رواه الخمسة إلا البخاري.

(٣) بەڵگەکەشی ئەوەیە: کە حەزرەتی (إبن الزبیر) دەفەرموێ: (پێغەمبەرﷺ ئاماژەی بە پەنجەی ئەکردو نەیدەجولاند).

أخرجه أبو داود والبیهقي وهو حدیث صحیح.

وە ئەگـەر هـاتوو بـەردەوام جوولانـدی ئـەرا مەکرووهەو نوێژی پێ بەتاڵ نـابێ لەسـەر فـەرموودەی ڕاست، وە لـە فەرموودەیـەکی بـێ هـێزدا هـاتووە کـە نوێژی بەتاڵ دەبێ... تا کۆتایی وەڵامەکەی خـوا لێـی ڕازی بێ...

بەڵام وەڵامی تێرو تەسـەلی ئـەم پرسـیارە بـەوە دەبێ کـە بەڵگـەکانی ئـەو کەسانە بهێنین کـە دەڵێـن سوننەتە پەنجەی خـۆت بجولێـنی، ئنجا لـەم بەڵگانـە دەکۆڵینـەوەو یـەك یـەك رەتـی ئەکەینـەوە هـەڵی ئەوەشێنینەوە بـە بەڵگـەی تـەواوو ڕاسـتو دروسـت، ئنجـا بەڵگـەکانی سـوننەت نـەبوونی ئـەم کـارە دەهێنینەوە لەگەڵ فەرموودەی زانـا لێکۆڵـەرەوەکانو باوەڕ پێ کراوەکان.

# باسی بەڵگەکانی ئەلبانی لەسەر سوننەتی پەنجە جووڵاندن کە لە کتێبی (صفة صلاة النبي) هاتووە

چەندین حەدیسی (ضعیف) بێ هێزی لەم کتێبەی خۆی بە (صحیح) داناوە[(٤)] و چەندین حەدیسی (صحیح)ی بە (ضعیف)و بێ هێزی داناوە[(٥)] کە روون و ئاشکرایە، بەڵگەکانیشی ئەمانەن:

---

(٤) وەکو حەدیسی (من كان له إمام فقراءة الإمام له قراءة) کە ئەلبانی لە لاپەڕە (٩٥) باسی کردووە لە چاپی شەشەم کە بە صەحیحی داناوە کەچی حەدیسێکی (ضعیف) بێ هێزە بە رێککەوتنی (حافظ)ەکان هەروەکو ئیمامی ابن حجر لە (فتح الباري) دەفەرموێ لە (بەرگی ٢) لاپەڕە (٢٤٢).
وتم: هەروەها ئیمامی نووی (لە مجموع بەرگی-٣ لاپەڕە-٢٤٩) وای فەرمووە. تەواو بوو.
هەروەها حەدیسی (مالي أنازَعُ...) لاپەڕە (٩٤) مێناریەتیەوە کە (حافظ)ەکان لەسەر ئەمە رێککەوتوون کە ئەم حەدیسە هەڵەیەو زیادەی تێ کراوە هەروەها چەند وتەیەکی حەزرەتی (أبو هريرة) تیادایە بڕوانە (المجموع)ی ئیمامی نووی (بەرگی-٣ لاپەڕە-٣٦٨).

(٥) وەکو حەدیسی حەزرەتی (عبدالله)ی کوڕی (الزبير) کە لەمەودوا بە تەواوی روونی دەکەینەوە کە (صحیح)ە کە رستەی (لا يحركها) واتا نایجولێنێ تێدایە کە ئەلبانی بە (ضعیف)ی داناوە لە لاپەڕە (١٧٠) کە چەندین فەرموودەناسی (حافظ) بە (صحیح)یان داناوە وەکو ئیمامی نووی لە (المجموع بەرگی-٣ لاپەڕە-٣٥٤) و ئیمامی بیهقی و ئیمامی ابن حبان و ئیمامی ذهبي و (حافظ)ی ابن حجر.

أ) حەدیسی حەزرەتی (وائِل)ی کوڕی (حُجُر) ڕەزای خوای لێ بێ کە باسی دانانی دەستەکان دەکا لە تەحیات، کە دەفەرموێ: (ثمّ رفع أصبعه فرأيته يحركها يدعو بها) رواه البيهقي.

ئەلبانی دەڵێ: رواه أبو داود والنسائي وابن الجارود وابن خزيمة وابن حبان وصححه ابن الملقن.

ب) لە دوای ئەمە (ئەلبانی) چەندقسەیەکی کردووە لەم خاڵانە کورتی ئەکەینەوە:

١) ئەم حەدیسە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە سوننەتە ئیشارەت بە پەنجە بکەی وە بیجولێنی تا سەلام دانەوە.

٢) ئەمە مەزهەبی مالیکو زانای تریشە.

٣) هەروەها پرسیار لە ئیمامی ئەحمەد کرا: ئایا نوێژکەر ئامازە بە پەنجەی خۆی بکات لە نوێژ؟ لە وەڵامدا فەرمووی بەڵێ زۆر بە توندی.

٤) لەمەش بۆمـان دەردەکـەوێ کـە جوولاندنـی پەنجە لە تەحییات سونەتێکی جێگیرە.

٥) هـەروەها دەڵـێ: حەدیسـی حـەزرەتی (إبـن الزبير) کە تیایدا دەفەرموێت (لا يحرکها) ئیسنادەکەی تەواو نی‌یە بە قسەی خۆی دەڵێ لە (ضعيف أبو داود) لێی کۆڵیتەوە.

٦) لە دوای ئەمە دەڵێ: ئەگەر ئـەم حەدیسـەش (صحيـح) بێـت ئـەوا دەڵێـــت: (نـــەیدەجوولاند) وە حەدیسـەکەی ئێمـە دەڵـێ: (دەیجوولانـــد) لـــە لایـــەن زانایان بەڵگەی کردنی شتێك لە پێش بەڵگەی نەکردنی ئەو شتەیە.

ئەمەیە بەڵگەکانی ئەلبانی لە کتێبی (صفة صلاة النبي)، چاپی شەشەم لاپەڕە/١٦٨.

# هەڵوەشاندن و ڕەتكردنەوەی بەڵگەكانی ئەلبانی لەسەر جوولانی پەنجە كە زۆر كەس پێی هەڵخەڵەتاوە

١) حەدیسی حەزرەتی (وائـل)ی كوڕی (حجـر) خوا لێی ڕازی بێت، ڕاستە حەدیسێكی صەحیحە تەنیا ووشـەی (یحركـها) واتـە: ئـەیجوولاند، كـە ووشــەیەكی (شـاذ)ە[٦]، چونكـە ئـەم حەدیسـە لـە ڕێگــای یـازدە پیـاوی بـاوەڕپێكراوی (حـافظ) ڕیوایــەت كـراوە، كـە یــەكێكیان ئــەم ووشــەیەیان نەگێڕاوەتــەوە، تــەنیا (زائدة)ی كوڕی (قدامـة) گێڕاویەتیـیەوە كـە كەسێكی باوەڕپێكراوە، ئەمەش پێچەوانەی ڕیوایەتی حەزرەتی (إبن الزبیر)ە

---

(٦) ووتم: حەدیسی (شــاذ) ئەوەیــە كــە كەسـێكی بــاوەڕ پێكــراو حەدیسێك بگێڕێتەوە مانای ئەو حەدیسە پێچەوانەی حەدیسی یەكێكی لە خۆی بەهێزترو باوەڕپێكراو تر بێت. تەواو بوو.

که تیایدا نـەجوولاندنی پەنجـەی سـەلماندووە، هەروەها پێچەوانەی ریوایـەتی حـەزرەتی (إبـن عمـر)ە خوا لێی رازی بێت کە لە صەحیحی موسلمدا هـاتووە، کە باسی پەنجـە جوولاندنـی نـەکردووە، زانایـەکان لـە زاراوەی حەدیس فەرموویتیان:

وما یخالف ثقة به الملا

فالشاذ والمقلوب قسمان تلا

واتە: ئەگەر کەسـێکی بـاوەرپێکراو حەدیسـێکی پێچەوانەی زۆرینەی خەڵك گـێڕاوە ئـەوا حەدیسـەکەی حەدیسـێکی (شـاذ)ە، وە حەدیسـی (مقلـوب) دووجۆرە[7].

---

(٧) ووتم: (الحـافظ إبـن حجـر العسـقلاني) دەفـەرمووێ حەدیسـی (مقلوب) دوو جۆرە یان یەکێك لە حەدیس گێرەوەکان ناوی خۆی‌و باوکی پێچەوانە کراوە، یان لە ووشەکانی حەدیسـەکە گۆڕانکـاری کـراوە پێـش‌و پاش کراوە. بڕوانە (شرح نخبة الفکر) لاپەڕە/٣٢، تەواو بوو.

هەروەها ئیمامی (الحافظ إبن خزیمة) (علة)ی بۆ ئـــەم زیادەیـــەی:- کـــە ووشـــەی (یحرکـــها)یـــە- دۆزیوەتـەوەو ئەفـەرمووێ: لـە هیـچ لـە حەدیســەکان ووشەی (یحرکها) نەهاتووە تەنیا لە ریوایـەتی (زائدة) نەبێ باسکراوە.

بڕوانە (صحیح إبن خزیمة) بەرگی/١، لاپەڕە/ ٣٥٤.

وە قسەکەی ئەلبانی کە دەڵێ: (رواه البیـهقي) ئەمـەیان راستە بـەڵام ئـەم ووشـە زیادەیـە کـاری پـێ ناکرێ هەروەك گووتمان، بەڵام ئەم قسەیەی کە دەڵـێ (رواه أبو داود) راست نی‌یە چونکە ئەلبانی وای ئەزانی کـە ئیمـامی أبـو داود ریوایـــەتی کـــردووە کـــەچی لـــە راستی‌دا ریوایەتی نەکردووە[٨].

---

(٨) یەکێك لە شـوێنکەوتوانی ئـەلبانی وای ئـەزانی ئـەم فەرموودەیـە لـە (سنن أبی داود)ە بە ژمارەی ٧٢٧، یان ویستی شـێخەکەی خـۆی سـەربخات، هەڵسا دوو سێ لاپەڕەی بۆ ناردن کە پڕی کردبوو لە جوێن‌و قسـەی ناشـیرین بـەڵام هیچی پـێ نـەبڕا!!، وە ئـەو حەدیسـەی کـە لـە (سـنن أبـی داود)ە دەربـارەی دەسـت بـەرز کردنەوەیـە لـە کـاتی ووتـنی (اللّٰه أکبر)ی ئیحـرام وە جووڵاندنی دەست لە ژێر جلو بەرگ لە کاتی سەرمابوون. جا ئاگادار بە.

٢) وە ئەو قسەيەی کە دەڵێ: (ئەمە بەڵگەيە لەسەر ئەوەی کە سوننەتە بەردەوام ئاماژە بە پەنجە بکە وە بيجوڵێنی تا سەلامدانەوە).

ئەو قسەيەی لێ وەرناگيرێ چونکە ئەلبانی ئيشی بەم ريوايەتە کردووە کە (شاذ)ە وە ئەو هەموو ريوايەتە صەحيحانەی بەجێ هێشت کە ئيمامە (حافظ)ەکان بە صحيحيان داناوە وەکو ريوايەتی حەزرەتی (إبن عمر) کە لە صحيحی موسلمدا هاتووە، چونکە زۆر حەزی لە شتی (شاذ)ە هەرچەند ئەم وشەيە (ضعيف)ە بە (شاذ)ی‌يەکەی[٩]، هەروەها ريوايەتی حەزرەتی (إبن الزبير)ی بەجێ هێشتووە کە ئيمامی (أبو داود والبيهقی) بەچەند ئيسنادێکی صحيح ريوايەتيان کردووە،

---

(٩) ووتم: ئەگەر حەديسێك (شاذ) بوو ئەوا ئيشی پێ ناکرێت و وەکو حەديسی (ضعيف)ی لێ دێ. تەواو بوو.

نەك هەر ئەوەندە بەڵكو حەدیسەكەی بە (ضعیف) داناوە كە لەمەودوا روونی ئەكەینەوەو دەیسەلمێنین كە حەدیسێكی صحیحە.

٣) وە ئەو قسەیەی كە دەڵێ: مەزهەبی ئیمامی مالك لەسەر ئەوەیە كە پەنجە جوولاندن سوننەتە...

دەڵێین: ئەلبانی قسەی ئیمامی مالكو غەیری ئەم ئیمامە بەڕێزە بە بەڵگە دانانێ، كەواتە هیچ سوودی نیە هێنانەوەی ئەم قسەیە بەتایبەتی كە ئەلبانی قسەی ئیمامە بەڕێزەكان بە بەڵگەی شەرعی دانانێ. وە بە ئەلبانی دەڵێین دەربارەی جوولاندنی پەنجە (خلاف) هەیە لە مەزهەبی ئیمامی مالك لە كتێبی (عون المعبود) بەرگی-٣ لاپەڕە (٤٥٥)دا هاتووە: شێخ سلام الله لە (شرح الموطأ) دەفەرموێ لە حەدیسی حەزرەتی (وائِل)ی كوڕی (حجر) هاتووە

که أبو داود[10] ریوایەتی کردووە: (ئنجا پەنجەی بەرز کردەوەو[11] بینیم دەیجوولاند دوعای پێ دەکرد). لەم حەدیسە ئەوە وەردەگرین کە پەنجەی شەهادە دەجوولێنین لەکاتی بەرز کردنەوە، ئەم رایەش رای ئیمامی مالكو زۆربەی زانایانە، بەڵام مەبەست بەم جوولاندنە تەنها بەرز کردنەوەیە هیچی تر نا، بەمەش دژایەتی حەدیسەکەی (مسلم) ناکا کە لە حەزرەتی (ابن الزبیر) ریوایەت دەکا کە دەفەرموێ (پێغەمبەرﷺ ئاماژەی بە پەنجەی ئەکرد لەکاتی دوعا کردنو نەیدەجوولاند)[12]. تەواو بوو لە (عون المعبود).

---

(١٠) ئەلبانی وای ئەزانی کە قسەی ئەم زانایە بەرێزە تەواوە، ئەویش یەکسەر وتی: رواه أبو داود. ئەمەش گەورەترین بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەلبانی محدث نیە بەڵکو تەنیا قسەی زانایەکان دەگێڕێتەوەو بێ لێکۆڵینەوە.

(١١) وتم: مەبەستی پەنجەی پیرۆزی پێغەمبەرەﷺ. تەواو بوو.

(١٢) ئەمە لە (صحیح مسلم)دا نیە بەڵکو لە (سنن أبي داود) هەیە جا ئاگاداربە.

وتم: سبحان الله! كاتێ بۆچوونی ئیمامی مالك لەگەڵ ویستی ئەلبانی تێك ئەكاتەوە وەری دەگرێو ئەیكاتە بەڵگە، بەڵام ئەگەر بۆچوونی ئەم ئیمامە لەگەڵ رایەكەی ئەلبانی نەگونجا بەدیواری دائەدا!!

هەر دەڵێی ویستی ئەلبانیو بۆچوونەكەی قورئانو سوننەتە كەس نابێ بیگۆڕێو دژایەتی بكا.

ئەوەش دەبێ بزاندرێ كە ئیمامە بەڕێزەكانی سەر مەزهەبی ئیمامی مالك ئەم پەنجە جوولاندنەی ئەلبانییان مەبەست نییە، ئەگەر مەبەستیشیان بێ ئەوا نابێتە بەڵگە لەلای ئێمەو لای ئەلبانی، ئەی بۆچی ئەلبانی گوێی نەدا بە فەرموودەی ئیمامی مالك كە دەفەرموێ: ئەو حەدیسە راست نییە كە دەفەرموێ: حەرامە كەسێك بەڕۆژوو بێ لە رۆژی شەممە جگە لە رۆژووی فەرز نەبێ. كەچی ئەم ئیمامە بە (گەورەی

ئیمانداران) ناسراوه له حەدیس هەروەها یەکێکە لە
زانایانی (سەلەف)؟؟

ئێمەش بەیارمەتی خودا ئەوە دەسەلمێنین کە
پەنجە جوولاندن سوننەت نییە، کە ئەم شتەش
سەلمێندرا، ئایا ئەلبانی واز لە مەزهەبی ئیمامی مالك
دەهێنێ‌و بەدوای سوننەت دەکەوێ هەر وەکو خۆی
دەڵێ یان هەر لەسەر قسەی خۆی دەمێنێتەوە؟!

٤) ئەو قسەیەی کە دەڵێ: (لە ئیمامی
ئەحمەدیان پرسی دەربارەی ئیشارەت کردن لە نوێژ،
فەرمووی بەڵێ زۆر بە توندی). ئەمە هیچ بەڵگەیەکی
تیا نییە، چونکە هیچ لە قسەکانی ئەم ئیمامە بەڕێزە
دەربارەی پەنجە جوولاندن نییە، بەڵکو دەربارەی
ئیشارەت پێ کردنە، وە مەزهەبی ئیمامی ئەحمەدو
زانایانی سەر مەزهەبی ئەو نەجوولاندنی پەنجەیە، هەر

ئــەو زانایانەش ئاگادرترو زانــاترن بــە فــەرموودەكانی ئیمـامی خۆیـانو ماناكـــەیانو راســـتیو ناڕاســـتییان، خـاوەنی كتێبی (الـروض المربـع) كـە حەنبەلیـیــە لــە (بـەرگی-١ لاپــەڕە-٥٩) دەفـــەرموێ: (و ئامــاژە بـــە پەنجەی شادە ئەكا بەبێ جوولاندن لــەكاتی تـەحیاتو دوعاكردنی لە نوێژو لە غەیری نوێژ لەكاتی یاد كردنـی خـــوای گـــەورە تـــاكو ئاگـــاداركردن بـــێ لەســـــەر یەكتاپەرستی). وە كتێـبی (الـروض المربـع) كتێبێكـی كورتی پەسند كراوە لـە مەزهــەبی ئیمـامی أحمـد. وە گەورەی زانایانی مەزهەبی ئیمام أحمد كە ئیمامی (ابن قدامة) دەفەرموێ لە (المغني) بەرگی-١ لاپەڕە-٥٢٤: (و ئاماژە بە پەنجـەی شـادە دەكـاو بـەرزی ئەكاتــەوە لـەكاتی یـادكردنی خـوای گـەورە لـە تـەحیات لەســـەر ریوایـەتی حـەزرەتی (عبـــدالله)ی كـوڕی (زبـیر)، كــە

پێغەمبەرﷺ ئامازەری بە پەنجە ئەکردو نەیدەجوولاند) رواه أبو داود..

ئێمەش دەڵێین: کێ زاناترە بە قسەکانی ئیمامی أحمد ئیمامی (ابن قدامة) کە گەورەی زانایەکانی ئەم مەزهەبەیە، یان ئەلبانی؟!!

هەروەها لە کتێبی (المبدع شرح المقنع) کە ئیمامی (ابن مفلح)ە دەفەرموێ لە (٤٦٢/١):

بەهەر حاڵ نابێ بیجوولێنێ لەسەر فەرموودەی راستتر لەبەر ئەوەی کردەوەی پێغەمبەرەﷺ، خاوەنی کتێبی (الغنیة) دەفەرموێ: بەردەوام تەماشای پەنجەی شادە دەکا لە تەحیات لەبەر حەدیسەکەی (ابن الزبیر). رواه أحمد.

ئێمەش بە ئەلبانی دەڵێین: ئەگەر وامان دانا کە ئیمامی أحمد دەیفەرموو بەو پەنجە جوولاندنەی کە

تۆ دەیڵێی، بەڵام سوننەتی پێغەمبەرﷺ پێچەوانەی ئەم قسەیە بوو، ئایا هەر دەمارگیری بۆ ئیمام أحمد دەکەی؟!!

٥- وە ئەو قسەیەی کە دەڵێ (لەمە بۆمان دەردەکەوێ کە پەنجە جوولاندن لە تەحیات سوننەتێکی جێگیرە).

وەڵامەکەی: بەڵێ بەرز کردنەوە یەك جار ئەمە جوولاندنەکەیە کە سوننەتێکی تەواوە نەك بەردەوام بیجوولێنێ وەکو (شێخی ئەلبانی) وا تێگەیشتووەو دەڵێم: ئەگەر حەدیسە وا بگەینێ کە ئەلبانی وا تێگەیشتووە ئەوا حەزرەتی (وائل)ی کوڕی (حُجْر) نەیدەفەرموو: (ثم رفع اصبعه فرأيتها يحركها) واتا: پاشان پەنجەی بەرز کردەوەو بینیم ئەیجوولاند. چونکە مانای ئاشکرای ئەم ریوایەتە ئەوەیە کە پێغەمبەرﷺ پەنجەی خۆی دانا بوو ئینجا ئاماژەی پێ کرد، بە بەڵگەی ریوایەتی حەزرەتی (ابن عمر) لە (صحيح مسلم): (وعقد

ثلاثة وخمسين و أشار بالسبابة) واتا: دەستی وەکـو (٥٣
پەنجاو سێ لێ کردو ئاماژەی بە پەنجە کرد، کەواتـە روون
بۆوە کـە پێغەمبـەر ئامـاژەی پـێ کـرد پـاش ئـەوەی کـە
دانـابوو لـە سـەرەتای (تـەحیات)، ئەمـەش مەبەسـتی
حەزرەتی (وائل بن جحر)ە بـە وشـەی جوولانـدن، ئەمـە
ئەگەر وامان دانا کە ئەم حەدیسە تەواوەو (شـاذ) نیـەو،
حەزرەتی (وائل) قەت مەبەستی ئەمە نەبوو کـە بـەردەوام
بیجوولێنی هەروەکو دەقەکان وا دەگەیەنن، بەلاَم ئەلبانی
پێچەوانەی ئەمانە هەموویان دەجولێو دەلێ کە بـەردەوام
پەنجەی خۆت بجوولێنەوە لە سـەرەتای تـەحیات، لەگـەلَ
ئـەوەش ریوایـەتی (لا یحرکـها) واتـا نـایجوولێنێ کـــە
صەحیحە ئەم قسانەی کە وتمان دەسەلمێنێ.

٦- و ئەم قسەیەی کە دەلێ: حەدیسی (لا یحرکها)
واتا: نایجوولێنێ، ئیسنادەکەی تـەواو نیـە. ئـەو قسـەیە
هەلّەیەو بەسـەری دائەدرێتـەوە، ئـەوەش حەدیسـەکەو
ئیسنادەکەیەو فەرموودەی (حافظ)ەکان دەربارەی:

ئیمـــامی أبـــو داود لــــه کتێـــبی (ســــنن)[١٣] دەفـەرموێ: (ابراهیـم)ی کـوڕی (الحسـن المصیصـــی) پێی وتین کە (حجـاج) هـەواڵی دایـنێ لـە (ابـن جریـج) گێڕایتەوە لە (زیاد) لـە (محمـد)ی کـوڕی (عجـلان) لـە (عامر) لە (عبدالله) کوڕی (الزبیر) کە باسی کـردوە (ان النبيﷺ كان يشير باصبعه اذا دعـا ولا يحركـها) واتـا: پێغەمبەرﷺ ئاماژەی بە پەنجە ئەکرد کاتی دوعـاو[١٤] نەیدەجوولاند.

---

(١٣) باسـی ئامـاژە کـردن لــــە تــەحیات، لــە باســەکانی نوێــژ - حەدیسی ژمارە (٩٨٩).

(١٤) وتم: (واتا) لە تەحیات. تەواو بوو.

# باسی پیاوەکانی (اسنادی) ئەم حەدیسەو فەرموودەی زانایانی دەربارەیان

أ) (ابراهیم)ی کوڕی (الحسن المصیصی): ئیمامی (حافظ) لە کتێبی (تقریب التهذیب)[١٥] (ص٨٩ رقم ١٦٤٤) دەفەرموێ: باوەڕ پێکراوە. (دس) واتە ابو داود ونسائي حەدیسیان لێ ریوایەت کردووە).

ب) (حجاج)ی کوڕی (محمد): لە کتێبی (الجرح) ج-٣ لاپەڕە-٦٦/٧٠٨ دەفەرموێ: علي المدني دەفەرموێ: پیاوێکی باوەڕپێکراوی راستگۆیە، هەروەها ئیمامی الحافظ لە کتێبی (تقریب التهذیب) لاپەڕە (١٥٣) ژمارە ١١٣٥: باوەڕپێکراوەو[١٦] حەدیسەکانی تەواوە[١٧].

(١٥) ئەم کتێبە لە چاپکرانی دار البشائر لێکۆڵینەوە شێخ محمد عوامە خوا سەرکەوتووی بکا.

(١٦) هەندێ بێ عەقڵی دەمارگیر چەند قسەیەکی بێ سوودیان کردووە دەربارەی ئەو کەسە، کە گوێ پێ نادرێ!!

(١٧) ئیمامی البخاري و مسلم و ابو داودو الترمذي و النسائي و ابن ماجە حەدیسیان لێ ریوایەت کردوە.

ج) ابن جريج: له كتێبى (الجـرج ٥/٢٥٧/١٦٨٧) دەفـەرموێ: ئيمامى أحمد دەفـەرموێ: ابـن جريـج: حەديسەكانى صەحيحو تـەواونو هيـچ حەديسـێكى نەگێڕاوەتەوە مەگەر زۆر چاك نەيزانى[18].

د) زياد كوڕى سعد: له كتێبى (جرح) دەفەرموێ ئيمامى أحمـد دەفـەرموێ: خـەڵكى خوراسـانەو باوەڕپێكراوە. تـەواو بوو لـە كتێبى (الجرح)، وە لـە كتێبى حەديسەكان تەواون[19].

هـ) محمد كوڕى عجلان: لـە كتێبى (المـيزان) ٣/٦٦٤/٧٩٣٨ دەفـەرموێ: ئيمـامێكى راسـتگۆى بەناوبانگە ئيمامى أحمدو ئيمامى ابن عيينـة و ئيمـامى ابو حاتم بە باوەڕپێكراويان داناوە

(١٨) ئيمامى البخاري و مسلم و ابو داودو الـترمذي و النسـائي و ابـن ماجـە حەديسيان لێ ريوايەت كردوە.

(١٩) ئيمامى البخاري و مسلم و ابـو داودو الـترمذي و النسـائي و ابـن ماجـە حەديسيان لێ ريوايەت كردوە.

(ئیمامی مسلم‌و ابو داودو ترمذي و نسائي و ابن

ماجه) حەدیسیان لیّ گێڕاوەتەوە.

و) عامری کوڕی عبدالله، خاوەنی کتێبی الجرح

دەفەرموێ: (٩٠/٣٢٥/١٨١٠) ئیمام أحمد دەفەرموێ

باوەڕپێکراوە و لە تقریب دا هاتووە (باوەڕپێکراوەێکی

خوا پەرستە ئیمامی بخاری‌و مسلم‌و أبو داودو ترمذي

و نسائي و ابن ماجە حەدیسیان لیّ ریوایەت کردووە.

ئەمانەن پیاوانی (اسناد)ی لەم حەدیسە، وا

بەچاوی خۆت بینیت کە هەموویان باوەڕپێکراوی

خاوەن رێزن‌و، ئەمەش فەرموودەی

فەرموودەناسەکانە دەربارەی ئەم حەدیسە؟

– ئیمامی نەوەوی دەفەرموێ لە (مجموع)

(٣/٤٥٤) ئیمامی بیهقی بە (اسناد صحیح) لە (ابن

الزبیر باسی کردووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئامـاژەی

بــه پەنجــەی خــۆی دەکــرد کــاتێ دوعــای ئــەکردو نەیدەجوولاند. رواه أبو داود باسناد صحيح.[20]

کەواتـە حەدیسـەکە صەحیحــەو هیــچ گومــانی لەسـەر نییـە، دەڵێـم: هــەموو کەسـێکی دادپــەروەر دەڵێ: چۆن ئەلبانی جورئەتی کرد کـە ئـەم حەدیسـە (ضعيف) بکا، بێ گومان ئەم حەدیسە بۆیـە ضەعیفـە چونکـە لەگــەڵ هــەواو ئــارەزووی ئــەلبانی تێکــی نەکردۆتــەوە ئــەو ئـارەزووەی کــە دەڵــێ: پەنجــەی بجوولێنە تاوەکو سەلام دەدەیتەوە.

٧-) ئـەو قســـەیەی کــە دەڵــێ: (ئەگــەر ئــەم حەدیسە صەحیحە بێ ئەوا مانای نەکردنــە، وە مانـای حەدیسـەکەی تـر کردنـەو،بەڵگـەی کردنیـش لـە پێـش بەڵگەی نەکردنە هەروەکو زانراوە لەلای زانایان).

---

(٢٠) هەروەها بڕوانە سنن البيهقي ٢/١٣١/١٣٢.

دەڵێم: ئەلبانی خۆی پاراست بە وشەی: "ئەگە
ئەو حەدیسە صەحیح بێ" ئەگەر هاتوو یەکێك لە
زانایان بە صەحیحی داناو بۆ خەڵکی روونی کردەوەو،
حەدیسەکەش صەحیح بەبێ گومان، بەمەش ئەلبانی
خۆی پاراست لە تانە لێدان، لەم قسەیەشی
ئاماژەیەکە بۆ ئەوەی کە حەدیسەکە صەحیحە لەلای
ئەو بەڵام دەیشارێتەوە چونکە لەگەڵ هەواو ئارەزووی
تێك ناکاتەوە، هەروەکو روونمان کردەوە،
حەدیسەکەش تەواوەو صەحیحە هەروەکو زانایە
بەڕێزەکان وایان فەرمووە، ئەوەندەش بەسە کە
ئیمامی بیهقیو ئیمامی نووی ئەم حەدیسەیان بە
صحیح داناوە.

– وە ریوایەتی حەزرەتی (وائل)ی کوڕی (حجر)

کە وشـەی "یحرکها" واتـا جوولاندنـی تێدایـە ئەگــەر وامــان دانــە صەحیحــە، دژایــەتی لەگــەڵ ریوایــەتی حەزرەتی (عبدالله) کوڕی (الزبیر) هەیە کــە وشـەی "لا یحرکها" تێدایـە. واتــا: نــەیدەجوولاندو بــە زانسـتی (اصول الفقه) دا دەبێ.ئەم دوو ریوایەتە کۆ بکەینــەوە هەروەکو زانایاکانی ئەم زانستە دەفەرموون:

فالجمع بينما تعارضا هنا

في الاولين واجب ان أمكنا

واتا: ئەگەر دوو دەقی ئاینی ماناکەیان دژایــەتی یەکتریان دەکرد، ئەوا واجبــە کۆیــان بکەینــەوە ئەگــەر بتوانرێ.

ئەلبانیش دەڵێ: بەڵگەی کردن لەپێش بەڵگەی

نەکردنە هەروەکو دانراوە لەلایەن زانایان.[21]

ئێمەش پێی دەڵێین: راستە، کردن لەپێش نەکردنە بەڵام ئەگەر نەمانتوانی کۆیان بکەینەوە ئەمەیە زانراوە لەلایان زانایان، جا بزانە ئەی مرۆڤی ئاقڵو ژیر: ئەلبانی ئەو رستەیەی "ئەگەر نەمانتوانی کۆیان بکەینەوە"ی لابرد تاوەکو ئەو شتەی کە ئەو دەیەوێ جێگیربێو پێک بێو گرنگ نییە لەلای ئەو ئەم شتە رووی بدا بەهۆی شاردنەوەو لابردنی تەواوی فەرموودەی زانایان یان نا.

---

(٢١) و قوتابییەکەی ئەلبانی خاوەن کتێبی "ارشاد الساری" لە بەشی سێیەم -رۆژوو- چاپی چوارەمی نوێ- لاپەرە-٤٣ دەڵێ: یاسایەکی (اصول الفقه) دەڵێ: نەکردن لەپێش کردنە؟

لێرە قوتابییەکانی ئەلبانی قسەی مامۆستاکەیو زانایانی (اصول الفقه) سەرەخوار کردو بەرەنگاری کرد بۆ ئەوەی ئەو حەدیسە زۆرانەی پێغەمبەر کە بەڵگەن لەسەر دروست بوونی بەرۆژوو بوونی رۆژی شەممە رەت بکاتەوە بە حەدیسێکی ضەعیف کە قەدەغە دەکات لە بەرۆژوو بوونی ئەم رۆژە، جا ئەی ئاقڵی ژیر تەماشا چۆن یاساکانی اصول الفقه وەردەگێڕن تاوەکو ئارەزووە خراپەکانیان بهێننە دی.

وه رێگای راست لەلایەن زانایان ئەوەیە کە دەڵێن: زانایەکانی -اصول الفقه- دەفەرموون: ئەو بەڵگەی کە کردنی تیادایە لەپێش ئەو بەڵگەیەیە کە نەکردنی تیادایە ئەگەر نەتوانریٚ کۆیان بکرێتەوە. خاوەنی (مراقي السعود) دەفەرمویٚ:

والجمع واجب متى أمكنا

إلاّ فللأخير نسخ بينا

واتا: ئەگەر دوو بەڵگە بەرەنگاری یەکتریان کرد ئەوا واجبە کۆ بکرێنەوە، ئەگەر نا ئەوا بەڵگەیەی کە لە دواییدا هاتووە بەڵگەکەی پێشتر (نەسخ) دەکا. واتا: حوکمەکەی لادەبا.

وه ئێمە پێش ئەوەیەی کە باسێکی تایبەتی دابنێین کۆ کردنەوەی ئیمامەکانو شەرعزانەکان نێوان وشەی (لا يحركها)[22]و وشەی (يحركها)[23]، ئەگەر ئەم

---

(٢٢) نەیدەجوولاند. (٢٣) ئەیجوولاند.

وشەیەی ریوایەتە هاتووە صەحیح بێ، پێش
ئەوە لەم، ئێمە بۆت دەسەلمێنین کە ئەم وشەیە
واتا: (یحرکها)[24] لە حەدیسی حەزرەتی (وائل)ی
کوڕی (حجر) شاذ "ریزپەرە"و ئیشی پێ ناکرێو
دەڵێن:

## باسی: روونکردنەوەی ئەوەی کە وشەی ( یحرکها ) "شاذ"ە[25] لە حەدیسی ( وائل )ی کوڕی ( حجر )

-بزانە:- خوا رەحمان پێ بکا- کە ئیما می
(الحافظ ابن خزیمة) ئیشارەتی کردووە بەڵکو
راستەوخۆ فەرموویەتی بەوەی کە وشەی (یحرکها)
واتە ئەیجولاند وشەیەکی (شاذ)ە لە صەحیحی خۆی
بەرگی ١ لاپەڕە ٣٥٤، دەفەرمووێ:

---

(٢٤) ئەیجوولاند.

(٢٥) واتا: ریزپەڕە.

له هیچ له حەدیسەکان (یحرکها) نەهاتوە تەنیا له حەدیسی (زائدة)[٢٦] هاتووه. تەواو بوو قسەکانی (الحافظ إبن خزیمة).

وه له دوای ئەوەی بەدوای حەدیسەکان گەڕاین لە کتێبە حەدیسی‌یەکان[٢٧]، دیتمان کە ١١ پیاوی باوەڕ پێکراوی (حافظ) حەدیسەکەی حەزرەتی (وائل)ی کوڕی (حجر)یان ریوایەت کردووەو وشەی جولاندنی تێدا نی‌یە، وه (زائدة) بە تەنیایی وشەی جوولاندنی باس کردووه کە پیاوێکی باوەڕ پێکراوە، ئەمەش (شذوذ) واتە/ ریزپەڕی‌یە، بە تایبەتی ئەگەر بزانین کە ریوایەتە صەحیحە بە راشکاوی باسی نەجوولاندنی کردووه ئەویش ریوایەتی (إبن زبیر) کە (حافظ)ەکان بە صەحیحیان داناوه وه ریوایەتی

---

(٢٦) ئەم وشەیە بە هەڵەیی هاتووه له چاپی نوێی (صحیح إبن خزیمە) بەبێ (ة) هاتووه.

(٢٧) واتە (مسند و سنن معاجم).

حەزرەتی (إبن عمر) لە صەحیحی موسلیم هە
باسی جوولاندنی نەکردووە ئێستاش ناوی ئەو باوە
پێکراوە (حافظ)انە دەهێنین کە حەدیسەکە
حەزرەتی (وائل)یان ریوایەت کردووە بەبێ ئەوەی
باسی جوولاندنی پەنجە بکەن کە (زائدة) بە
پێچەوانەیان باسی کردووە:

١- سفيان الثوري.

٢- سفيان بن عيينة.

٣- شعبة بن الحجاج.

٤-عبدالواحد بن زياد.

٥- عبدالله بن إدريس.

٦- زهير بن معاوية.

٧- أبو عوانة اليشكري.

٨- أبو الأحوص سلام بن سليم.

٩- بشر بن المفضل.

١٠- خالد بن عبدالله الطحان.

ئەمانە هەموویان باوەڕپێکراو و (حافظ)ن

١١- غیلان بن جامع.

ئەمەشیان باوەڕ پێکراوە.

-إنشاء الله- باسێکی تایبەتی تەرخان بکەین هەموو ریوایەتی ئەم بەڕێزانە باس دەکەین وە کتێبەکانی لاپەڕەکان دیاری دەکەین.

ئەمەش بەشێوەیەکی تەواو دەسەلمێنین کە جوولاندن (شاذ)ە، چونکە (الحافظ إبن خزیمة السلفي) وای فەرمووە هەروەها زانایە شارەزاکان لە (فقه)و (حدیث) ئەم جوولاندنەیان پشت گوێ خستووە چونکە یاساکانی حەدیس‌و (أصول الفقه) دەقیان لەسەر ئەوەیە کە ئەگەر کەسێکی باوەڕپێکراو شتێکی پێچەوانەی چەند باوەڕپێکراوێك هێنا ئەوا با (شاذ)

ریزپەڕ دائەنرێ، هەروەها لەبەر ئەوەی حەدیسە صەحیحەکانی تر بەڕاشکاوی دەڵێن (نەیدەجوولاند).

هەروەها ئەوەی بەدەرکەوت کە ئەلبانی بێ تێڕوانین حەدیسەکەی پەنجە جوولاندنی بە صەحیح دانا، هەورەها بێ تێڕوانین ئەو حەدیسانەی پێچەوانەی ئەم حەدیسە (ضعیف)ی کردن و بەبێ بەڵگەیەکی تەواو ئەم کارەی ئەنجام دا.

بە هیچ جۆرێك ناتوانین وشەی (یحرکها) واتە ئەیجولاند بە زیادەی باوەڕپێکراو دابنێین[28]، بە تایبەتی ئەگەر بزانین کە یاساکانی زانستی زاراوەی حەدیس لەسەر ئەمە نییە، ئیمامی (الحافظ العراقي) لە (الألفیة)ی خۆی لە یاساکانی حەدیس دەفەرموێ:

---

(٢٨) وتم: زیادەی باوەڕپێکراو: ئەوەیە کە چەند ریوایەتێك بۆ یەك حەدیس بێت بەڵام لە هەندێکیان زیادە هەبێ ئەم زیادەیە وەردەگیرێ وە حوکمی لێ دەردەهێندرێ ئەگەر ئەو کەسەی ریوایەتی کردبوو باوەڕپێکراو بێ. تەواو بوو.

وذو الشذوذ ما يخالف الثقة

فيه الملا الشافعيُّ حققه

واته: (شاذ) ئەوەیە کە باوەڕپێکراو پێچەوانەی زۆرینەی خەڵك بێ ئاوا ئیمامی شافعی بڕیاری داوە.

ئینجا ئیمامی عراقی فەرمووی لە شەرحەکەی: زانایان رایان جیاجیایە دەربارەی پێناسەی حەدیسی (شاذ)، ئیمامی شافعی دەفەرموێ: (شاذ) ئەو حەدیسە نیيە کە باوەڕپێکراوێك حەدیسێك ریوایەت بکا کەسی تر ریوایەتی نەکردبێ، بەڵکو (شاذ) ئەوەیە کە کەسێکی باوەڕپێکراو حەدیسێك ریوایەت بکا پێچەوانەی ریوایەتی زۆرینەی خەڵك بێت، ئیمامی (أبو یعلى الخلیلي) ئەم رایەی لە کۆمەڵێك لە زانایانی (حجاز) گێڕاوەتەوە، ئیمامی (الحاكم) دەفەرموێ: حەدیسی (شاذ) ئەو حەدیسەیە کە کەسێکی

باوەڕپێکراو بە تەنیایی ریوایەتی بکاو (متابع)[٢٦]ی نەبێ.

واتە: ئیمامی (الحاكم) بە مەرجی دانەناوە کە پێچەوانەی زۆربەی خەڵك بێت.

ئیمامی (الحافظ العراقي) لە روون کردنەوەی ئەو زیادانەی کە باوەڕپێکراوەکان ریوایەت ئەکەن دەفەرموێ: ئەو زیادانەی کە باوەڕپێکراوەکان ریوایەت ئەکەن: (الشیخ ابن الصلاح)ی (الحافظ) دەفەرموێ: وام بینی کە ئەو زیادەی باوەڕپێکراو ریوایەتی ئەکا بە تەنیایی بکەم بە سێ بەش:

---

(٢٩) وتم: ئیمامی نەوەوی دەفەرموێ: بۆ روون کردنەوەی مانای (متابع) ئەم نموونەیە دەهێنین: ئەگەر (حمّاد) حەدیسێك ریوایەت بکا لە (أیوب)، ئینجا بزانین کە جگە لە (حماد) یەکێکی تر ئەو حەدیسەی ریوایەت کردووە لە (أیوب)، ئەوا ریوایەتی ئەو کەسە پێی دەڵێن (متابع). بڕوانە (تدریب الراوي) بەرگی (١) لاپەڕە (٢٤٣).

یەکێکیان ئەو زیادەیەیە کە پێچەوانەی باوەڕپێکراوەکانی تر بێ ئەوا حوکمەکەی ئەوەیە کە وەرناگیرێ هەروەکو لەمەوپێش لە جۆری (الشاذ) روونمان کردەوە. تەواو بوو قسەکانی ئیمامی (الحافظ العراقي).

ووتم : هیچ کەسێکی وامان نەدۆزیەوە باسی پەنجە جوولاندن بکا و(متابعه)ی (زائده) بکا، ئەمەش دەقی فەرموودەی (الحافظ إبن خزیمه)ی لەسەرە هەر وەکو باسمان کرد.

وە بۆ ئەوەی گومان بەیەکجاری ببرینەوە دەڵێن : وامان دانا کەئەم ووشەیە (یحرکها) (شاذ) نەبوو، دەتوانین هەردوو جۆرە حەدیسەکە کۆ بکەینەوە هەر وەکو چۆن ئیمامە (حافظ)ەکان کۆیان کردۆتەوە، وەدەقی قسەشیان لەسەر ئەوەبوە کەئەو

پەنجەجوولاندنە نیە بەم شێوەیەی کە ئەلبانی ئەوەی بەقسەی هەڵخەڵەتاوە پێوەیان گرتووە ئەمەش فەرموودەکانیانە:

## روونکردنەوەی ڕێگای کۆکردنەوەی ئەم دوو جۆرە حەدیسە هەروەکو زانایانی(أصول الفقه)و حەدیس بڕیاریان داوە

بزانە- خوا رەحمەت پێ بکا - مەبەستی حەزرەتی (وائل بن حجر) ئەگەر راست بوو کە فەرموویتی (یحرکها)، مەبەستی بەرزکردنەوەی پەنجەی شادەیە لەدوای ئەوەی کە داندرابوو،و هیچی تری مەبەست نیە، ئەوەش ئاماژەیە بۆ یەکتاپەرستی، واتە پێغەمبەری ﷺ پەنجەی بەرز نەکردەوە لە سەرەتای تەحیات خوێندن بەڵکو بەرزی کردەوە لە کاتی گوتنی (أشهد أن لا إله إلا الله)، وحەزرەتی (عبدالله

بن الزبير) خوا لێی رازی بێ مەبەستەکەی بە پەنجە نەجوولاندن ئەوە بوو لە ووتەی (لايحركها) دووبارە کردنەوەی جوولاندنە زياتر لە يەك جار، ئەوجارەش بەرز کردنەوەکە بوو، ئەمەش دژايەتی نامينێ لەو نێوان ئەم دوو حەديسە، ئەمە کورتەی فەرموودەی زانايەکانە لەم مەسەلەيە، وە ئێستاش دەقی فەرموودەکانيان وەکو خۆی باس دەکەين و دەڵێين:

ئيمامی (الحافظ النووي) دەفەرمووێ لە (المجموع) بەرگی-٣ لاپەڕە ٤٥٥: (زانايەکان دەفەرموون: حيکمەت لە دەست دانان لەسەر ران لە تەحيات ئەوەيە کە قەدەغە بکرێن لە جوولان و شتی ناهەموار). تەواو بوو قسەکانی ئيمامی نەوەوی.

هەروەها ئيمامی نەوەوی لە هەمان شوێن دەگێڕێتەوە لە ئيمامی (البيهقی) کە دەفەرمووێ

مەبەست لە حەدیسی حەزرەتی (وائل بن حجر) لە

فەرموودەکەی: (یحرکها) ئەوەیە: ئاماژە پێکردن یە

جار، واتە بەردەوام نابێ لە جولاندنی بەمەش

مانایەکەی دژایەتی لەگەڵ ریوایەتی حەزرەتی (عبدالله

بن الزبیر) نابێ کە دەفەرمووێ: (لا یحرکها) واتا

نەیدەجوولاند. تەواو بوو قسەکانی ئیمامی بەیهەقی

کە لە (المجموع) گێڕدراوەتەوە.

هەروەها لە کتێبی خۆی (السنن الکبری) بەرگی

٢ لاپەڕە ١٣٢ی فەرمووە (لەگەڵ هەندێ دەستکاریو

کورت کردنەوە).

ئێمەش لە سەرەتای ئەم کتێبە فەتوای ئیمامی

(نەوەوی)مان باس کرد بەوەی کە پەنجە جوولاندن

مەکروهە لە نوێژ، وەئەو قسەیەی ئیمامی نەوەوی

بەم حەدیسە دووپات دەبێتەوە کە ئیمامی(أبو داود)

ڕیوایەتی کردووە لە (سنن)ی خۆی بە ئیسنادێکی صەحیح لە (نمیر الخزاعي) کە دەفەرمووێ (رأيت النبي ﷺ واضعاً ذراعه اليمنى على فخذه اليمنى رافعاً أصبعه السبابة قد حناها شيئاً) واتە: پێغەمبەرم بینی ﷺ دەستی ڕاستەی لەسەر ڕانی ڕاستەی دانابوو و پەنجەی شادەی بەرز کردبووەوە و کەمێك خواری کردبوو[30].

---

(١) ئەم حەدیسەش (الحافظ) بە صەحیحی داناوەو (مالك بن نمير الخزاعي) کە لە ئیسنادەکەی هەیە حەدیسی لێ وەرگیراوە هەروەکو لە (التقريب) باس کراوە، ئەو (مالك)ەش هەرچەند تەنیا یەك کەس حەدیسی لێ ڕیوایەت کردووە، بەڵام (حافظ)ەکان حەدیسەکەیان بە صحیح داناوە وەزۆر لە باوەڕپێکراوەکان تەنیا یەککەس ڕیوایەتی لێ کردوونە، وەکو (ثابت بن قيس الزرقي المدني) وەبەتەواوی ئەم شتەم ڕوون کردۆتەوە لە کتێبەکەی خۆم (إمتاع الألحاظ. بتوثيق الحفاظ)، وە ئیمامی (إبن خزيمة) ئەم حەدیسەی (مالك بن نمير) کە دەگێڕێتەوە لە باوکی خۆی بە صەحیحی داناوە لە صەحیحی خۆی بەرگی ١ لاپەڕە ٣٥٤، هەروەها (الحافظ إبن حجر) دانی ناوە بەم کارەی لە کتێبەکەی (الإصابة) ژمارە ٨٨٠٧، وە ئەم حەدیسە (إبن حبان) لە صەحیحی خۆی ڕیوایەتی کردووە هەروەکو لە کتێبی (الإحسان) بەرگی ٣ لاپەڕە ٢٠٢/ ١٩٤٣. هەروەها ئیمامی (أبو داود) لەبەرگی ١ لاپەڕە ٢٦٠/ ٩٩١، قسەی لەسەر نەکردووە ئەمەش بەسە بۆ بڕیاردان بەوەی کە ئەم حەدیسە صەحیحە وەپێچەوانەی ئەلبانی کە دەڵێ لە کتێبی (تمام المنة): (ضعيف)ە، ئینجا بینیم دژایەتی قسەکەی خۆی کردووە: حەدیسێکی صەحیح کردووە لە ڕیوایەتی (مالك بن نمير الخزاعي) لە (صحيح سنن النسائي) بەرگی ١ لاپەڕە ٢٧٢، جا جوان تەماشا کەن و بیر بکەنەوە!!!.

وه ئەم حەدیسە کە دەفەرموێت (لهي أشد علـى الشيطان من الحديد) واتە: پەنجە توند تـرە لـە سـەرە شـەیتان لـە ئاسـن، ئـەوا هیـچ بەڵگەیـەکی تێدا نی‌یـە لەسەر جوولاندنی پەنجە، بەڵکو ئەمە رادەگەیـەنی کـە ئەو کەسەی تەحیات دەخوێنێ کاتێ ئاماژە بە پەنجـە ئەکات بە یەکتاپەرستی لە نوێژ، هەروەکو ئەوەیـە کـە ئاسن لە شەیتان بدات، ئەمەش مانای ئـەوە نی‌یـە کـە شەیتان لە ژێر پەنجەکەیەتی لە کاتی جوولاندنی‌و پێی لێ دەدات وەکـو لێدانـی ئاسـن، هـەروەکو چـەند ناتێگەیشـتوویەك وا لێکیـان دابـۆوە، چونکـە هیـچ کەسێکی خاوەن عەقڵ ئەم قسەیە ناکـات. کاتـێ ئـەم قسانەش دەکەین دەبێ ئاگادار بین ئـەم حەدیسـە بـێ هێزی‌یـەك لـە ئیسـنادەکەی هەیـە، چونکـە پیـاوێکی تێدایـە کـە ئیمـامی (إبـن حبـان) بـە بـاوەڕ پێکـراوی

داناوه، بەڵام زۆربەی زانایان بە (ضعیف)یان داناوه ئیمامی (الحافظ) لە کتێبی (التقریب) دەفەرموێت (کثیر بن زید) راستگۆیە بەڵام هەڵە دەکاتو لە پیاوەکانی بوخاریو موسلیم نییە[١]، وەئەلبانی جاری وا دەبێ ئیسنادی وا بە (ضعیف) دادەنێ کە پیاوی وای تێدایە زۆر لە (کثیر بن زید) باشترو بەهێزترە ئەمەش زنراوەو ناسراوە لە کتێبەکانی خۆی.

بۆ نموونە: ئەلبانی دەڵێ لە (سلسلة الأحادیث الصحیحة) ژمارە ٣٤٣: وەئەوەی کە زانراوە ئەگەر (إبن حبان) یەکێکی بە باوەڕ پێکراو دابنێ ئەوا زانا لێکۆڵەرەوەکان پشتی پێ نابەستنو بەتەواوی دانانێن... یەکێك لەم زانایانە (الذهبي)یە. تەواو بوو قسەکانی ئەلبانی.

---

(١) ووتم واتە: ئیمامی بوخاریو موسلیم حەدیسیان لێ ریوایەت نەکردووە. تەواو بوو.

ئەلبانی ڕەددی ئیمامی (المنذري) داوە کـە ئـەم ئیمامـە ئیسـنادی حەدیسـێکی بـە حەسـەن دانـاوە وە یەکێکی تێدایە کە (إبن حبان) باوەڕ پێکـراوی دانـاوە، ئەلبانی دەڵێ لە ژمارە ١٠٥ی کتێبی (سلسلة الأحاديث الصحيحة): ئەمەش تـەماشا کردنێکـی تیادایـە چونکـە چەند جار گووتومانە کە (إبن حبـان) قسـەکانی تـەواو نین کاتێ یەکێك بە باوەڕ پێکراو دادەنێت.

هەورەها دەڵــێ لـە (حجـاب المـرأة) ژمـارە ١١٠: ئەم پیاوە بە نەناسراو دادەنرێ هەرچەند (إبـن حبـان) بە باوەڕ پێکراو دایبنێ، لەمەش دەزانرێ کـە (الحـافظ البوصـيري) چـاکی نـــەکردووە کاتـــێ کـــە فـــەرمووی: (إسنادە حسن). تەواو بوو قسەکانی ئەلبانی.

ئینجـا ئـەلبانی دژایـەتی قسـەکانی خـــۆی کـــرد حەدیسێکی (عبدالله بن يسار) بە صـەحیح دانـاو فێڵـی

ۆ کرد کە ئەم (عبدالله)یە هەرچەند تەنیا (إبـن حبـان)
یە باوەڕ پێکراوی داناوە بـەڵام چـەند کەسێکی بـاوەڕ
پێکراو حەدیسیان لێ ریوایەت کردووە. بڕوانـە (حجـاب
المرأة) لاپەڕە/٦٧.

هـەروەها (المـهاجر بـن عمـرو)ی بـە حەسـەن
داناوەو دەڵێ (إبـن حبـان) بـە بـاوەڕپێکراوی دانـاوەو
کۆمەڵێك لە پیاوی باوەڕپێکراو حەدیسیان لێ ریوایـەت
کردووە. بڕوانە (حجاب المرأة) لاپەڕە/١١٠.

هـەروەها دەربـارەی (یحیـی بـن مـالك) دەڵـێ:
وێنەی ئەم پیاوە حەدیسەکەی حەسەنە (إن شـاء الله)
لەبـەر ئـەوەی تابیعی‌یـەو لەبـەر ئـەوەی کۆمـەڵێك لـە
باوەڕپێکراوەکـان حەدیسـیان لێ ریوایـەت کـردووە...
بڕوانە (سلسلة الأحاديث الصحيحة)/٣٦٥.

هـەروەها حەدیسـی (إبـن سـلیط) بـە حەسـەنی

داناوه هەرچەندە کەس بە باوەڕ پێکراوی دانەناوە تەنیا (إبن حبان) نەبێ وە تەنیا یەك یان دوو کەس حەدیسیان لێ ڕیوایەت کردووە. بڕوانە (آداب الزفاف) لاپەڕە ٦٤و٨٨/ چاپی کۆن.

هەروەها ئەلبانی ئیمامی ئەبو حەنیفەی بە (ضعیف) داناوە لە حەدیس هەروەکو لە تەعلیقی خۆی بەسەر کتێبی (السنة لإبن أبي عاصم) بەرگی ١ لاپەڕە/٧٦، هەرچەند پیاوە باوەڕپێکراوەکان حەدیسیان لێ ڕیوایەت کردووەو ئوممەتی ئیسلام لەسەر گەورەیی باوەڕپێکراوی ئەم ئیمامە ڕێك کەوتوون... جا سەیر کەن چۆن ئەلبانی زمان درێژی دەکاتە سەر ئەم ئیمامە بەڕێزە کە بە (الإمام الأعظم) ناسراوە!!!.

# باسی حەدیسی (وائل بن حجر) کە پەنجە جوولاندنی تێدا باس کراوە

تەخریجێکی ئەم حەدیسەم بینی هی شێخ (شعیب الأرناؤوط) منیش وا بەتەوای دەینووسمەوە:

ئیمامی ئەحمەد لە کتێبی (المسند) بەرگی ٤ لاپەڕە ٣١٨، ریوایەت دەکا لە عبدالصمد، وە إبن خزیمە/٧١٤، ئیمامی بەیهەقی لە بەرگی ٢ لاپەڕە/١٣٢، لە ڕێگەی (معاویة بن عمرو).

(إبن الجارود)/٢٠٨ لە ڕێگەی (إبو الولید الطیالیسي) هەر پێنجیان لە (زائدة بن قدامة) دەڵێ (عاصم بن کلیب) پێی ووتم باوك پێی ووتم کە (وائل بن حجر) دەفەرمووێ... حەدیسەکە... کە تیایدا هاتووە (وعقد ثنتین من أصابعه وحلق حلقة ثم رفع أصبعه فرأیته یحرکها یدعوا بها) واتە ئینجا دوو پەنجەی

خۆی وەکو ئەلقـە لێ کـردوو پەنجـەی خـۆی بـەرز کردەوە بینیم ئەیجولاندەوەو دوعای پێ ئەکرد. ئەمـە ئیسـنادێکی صەحیحـە بـەڵام ووشـەی (یحرکها) واتـە ئەیجوولاند (شاذ)ە، (زائدە بن قدامە) بە تەنیایی ئـەم ووشـەیەی ریوایـەت کـردووە لـە نێـوان حـەدیس گێڕەوەکان لە (عاصم بن کلیب) ئەوانیش:

١- سفيان بن عيينة

٢- خالد بن عبدالله الواسطي

٣- قيس بن الربيع

٤- أبو الأحوص سلام بن سليم

٥- سفيان الثوري

٦- شعبة

٧- عبدالله بن إدريس

٨- زهير بن معاوية

٩- أبو عوانة

١٠- عبدالواحد بن زياد

١١- بشر بن المفضل

* حەدیسی (سفيان بن عيينة) له عاصم ئیمامی ئەحمەد لە موسنەدی خۆی بەرگی ٤ لاپەڕە/٣١٨وە الحمیدی/ ٨٨٥، وە ئیمامی النسائی لە بەرگی ٣ لاپەڕە ٣٤-٣٥، وە ئیمامی الطبرانی لە بەرگی ٢٢، لاپەڕە/٧٨،٨٥، ریوایەتیان کردووە بەم ووشانە (وأشار بالسبابة) واتە: ئاماژەی بە پەنجەی شادە کرد.

* وە حەدیسی (خالد بن عبدالله الواسطي)، ئیمامی البیهقی لە بەرگی ٢ لاپەڕە/ ١٣١، ریوایەتی کردووە بەم ووشانە (وأشار بالسبابة).

* حەدیسی (قيس بن الربيع) ئیمامی الطبرانی

له بەرگی ٢ لاپەڕە ٧٩ ریوایەتی کردووە بەم ووشانە: (وأشار بالسبابة يدعوا بها) واتە: ئامازەی بە پەنجەی شادە کردو دوعای پێ ئەکرد.

* وە حەدیسی (أبي الأحوص سلام بن سليم) ئیمامی الطيالسي ١٠٢٠ ریوایەتی کردووە بەم وشانە: (جعل يدعو هكذا يعني بالسبابة يشير بها) واتە: ئامازەی بە پەنجەی شادە ئەکردو دوعای پێ ئەکرد. هەروەها ئیمامی الطبرانی ئەمەی ریوایەتی کردووە لە بەرگی ٨٠/٢٢.

* وە حەدیسی (سفيان الثوري) ئیمامی عبدالرزاق لە المصنف ٢٥٢٢ ریوایەتی کردووە بەم وشانە: (ثمّ أشار بسبابته) واتە: ئینجا ئامازەی بە پەنجەی شادەی کرد. هەروەها ئیمامی الطبرانی لە بەرگی ٨١/٢٢ ریوایەت کردووە.

* وه حەدیسی (شعبة) ئیمامی أحمد له بەرگی ٤/٣١٦،٣١٩ وه ئیمامی الطبرانی لـه بـەرگی ٢٢/٨٣ ریوایەتیان کردووه بەم وشانه: (وأشـار بمسـبحته) واته: ئامـاژەی بـه پەنجەی شادەی کرد. هـەروەها ئیمامی ابن خزیمة /٦٩٧و٦٩٨ ریوایـەتی کـردووه بـەم وشانه: (وأشار باصبعه السبابة) واته: وه ئامـاژەی بـه پەنجەی شادەی کرد.

* وه حەدیسـی (عبـدالله بـن ادریـس الأودي) ئیمامی ابن ماجه/١١٢ ریوایەتی کـردووه بـەم وشـانه (رأيت النبيﷺ قد حلّق الإبهام والوسـطى ورفـع الـتي تليهما يدعو بها في التشهد) واته: پێغەمبەرمﷺ بیـنی پەنجەی گـەورەو پەنجەی نـاوەندی وەکـو ئەڵقـەی لێ کردبوو و ئەو پەنجەیەی کـه لـه دوایـان دێ[1] بـەرز کردبۆوەو دوعای پێ ئەکرد له تەحیات.

---

(١) مەبەستی پەنجەی شادەیە.

* وه حه‌دیسی (زهیر بن معاویة) ئیمـامی أحمد له بـه‌رگی ٤/٣١٨ وه ئیمـامی الطـبرانی لـه بـه‌رگی ٢٢/٨٤ ریوایه‌تیان کردووه به‌م وشانه: (وقبض ثنتین وحلّق حلقةً، ثمّ رأیته یقـول هکـذا، ورفـعَ زهـیرٌ اصبعه المسبحة) واته: ئینجا دوو په‌نجه‌ی به شێوه‌ی ئه‌ڵقه لێ کردو ئینجا بینیم ئاوای کرد، (زهیر) په‌نجـه‌ی شـاده‌ی به‌رز کرده‌وه.

* وه حه‌دیسی (أبي عوانة) ئیمامی الطبرانی لـه بـه‌رگی ٢٢/٩٠ ریوایـه‌تی کـردووه بـه‌م وشـانه (ودعـا بالسبابة) واته: به په‌نجه‌ی شاده دوعای کرد.

* وه حه‌دیسـی (عبدالواحـد بـن زیـاد العبـدي) ئیمامی أحمد له به‌رگی ٤/٣١٦ ریوایه‌تی کـردووه بـه‌م وشانه (وأشار بأصبعه السبابة) واتـه: وه ئامـاژه‌ی بـه په‌نجه‌ی شاده کرد.

* وه حەدیسی (بشر بن المفضل) ئیمامی النسائی ریوایەتی کردووه لە بەرگی ٢/٢٥-٣٦ بەم وشانه: (وقبض ثنتين وحلّق ورأيته يقول هكذا وأشار بالسبابة من اليمنى وحلّق الإبهام والوسطى) واتە: دوو پەنجەی نوقاندو ئەڵقەی کرد ئینجا بینیم ئاوای کرد: ئامـاژەی بە پەنجەی شادەی دەستی راسته کردو پەنجەی گەورەو پەنجەی ناوەندی کرد به ئەڵقه.

*　　*　　*

ئەو هەموو باوەڕپێکراوانە لە حەدیس گێڕەوەکانی (عاصم) باسی ئەو جوولاندنەی پەنجەی شادەیان نەکردووه کە (زائدة) بە تەنیایی ریوایەتی کردووه، ئەمەش ئاشکراترینو بەهێزترین بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە: (زائدة) هەڵەی کردووه لەم حەدیسه، ئەم قسەیەشمان دووپات دەبێتەوە ئەگەر

بزانين كه ريوايەتى ئەم باوەڕپێكراوانە تێك دەكاتەوە لەگەڵ حەديسە صەحيحە ريوايەت كراوەكان لە غەيرى (وائل بن حجر) وە لەم حەديسانە باسى جوولاندنى پەنجەيان نەكردووە وە لە هەندێكيان سەلماندنى ئامارەە پێكردن و نەفى كردنى جوولاندنى تێدايە هەروەكو لەمەودوا ئەيزانين.

ئيمامى مالك ريوايەتى كردووە لە (عبدالله بن عمر) لە الموطأ بەرگى ١/٨٨-٨٩ وە لە رێگەى ئەويشەوە ئيمامى مسلم (٥٨٠)، (١١٥) وە ئيمامى أبو داود ٩٨٧ وە ئيمامى النسائي ٣٦/٣/١٢٦٧ وە ئيمامى البيهقي بەرگى ١٣٠/٢ وە ئيمامى أبو عوانە بەرگى ٢٢٣/٢ وە ئيمامى أحمد لە بەرگى ٦٥/٢ دەگێڕنەوە لە مسلم بن أبي مريم دەگێڕێتەوە لە علي بن عبدالرحمن المعاوي فەرمووى: حەزرەتى عبدالله بن

عمر منی بینی دەستم لە وردە بەرد وەرئەدا لە نوێـژدا کاتێ تەواو بـوو پێمـی فـەرموو: ئـەم کـارە مەکـە، وە فەرمووی ئەم کارە بکە کە پێغەمبەرﷺ کردوویەتی.

وتم: پێغەمبەرﷺ چـی ئـەکرد؟ فـەرمووی: کـاتێ کـە دائەنیشت لـە نوێژدا، دەستی راستەی خۆی لەسـەر رانی راستەی دائەنا، وە هەموو پەنجەکانی ئـەنوقاند، وە ئامارەی بەو پەنجەیە ئـەکرد کـە لـەدوای پەنجـەی گەورەی دێ، وە دەستی چەپەی لەسەر رانی چەپـەی دائـەنا. وە هـەروەها ئـەم حەدیسـە ئیمـامی ابـن خزیمة/٧١٩ ریوایەتی کردووە لە رێگـەی اسماعیل بـن جعفر کە دەفەرموێ: مسلم بـن ابـي مریـم پێـی وتم لـە علي بن عبدالرحمن المعاوي دەگێڕێتەوە لـە حـەزرەتی عبدالله بن عمر... حەدیسەکە...

وە ئەم حەدیسە ئیمامی مسلم لە صەحیح خۆی

(٥٨٠) (١١٥) وه أبو عوانه له مسندی خۆی بەرگی ٢٢٤/٢ وه ئیمامی البیهقی بەرگی ٢/١٣٠ وه الدارمي بەرگی ٣٠٨/١ ریوایەتیان کردووه له ڕێگەی (حمّاد بن سلمة) دەگێڕێتەوه له أیوب ئەویش دەگێڕێتەوه له نافع ئەویش دەگێڕێتەوه له حەزرەتی ابن عمر كه پێغەمبەر ﷺ کاتێ دائەنیشت له تەحیات دەستی چەپەی لەسەر ئەژنۆی چەپی دائەناو دەستی راستەی لەسەر ئەژنۆی راستی دائەنا پەنجەکانی دەستی وەکو (پەنجاو سێ) لێ ئەکردو ئاماژەی بە پەنجەی شادە ئەکرد.

وه ئیمامی (الترمذي)/ ٢٩٤ وه أبو عوانه له مسندی خۆی بەرگی٢/٢٢٥ وه ئیمامی إبن خزیمه/٧٧١ ئەم حەدیسەیان ریوایەت کردووه لەڕێگەی عبدالرزاق له معمر دەگێڕێتەوه ئەویش له

عبيـدالله بـن عمـر دەگێڕێتـەوە، ئـەویش لـە نـافع دەگێڕێتەوە، ئەویش لـە ئـبن عمـر دەگێڕێتـەوە وەکـو ریوایـەتی ئیمـامی مسـلم لەگـەڵ پێـش خسـتنو دواخستنێکی هەندێ ووشە.

حەدیسی عبدالله بن الزبـیر ئیمـامی مسـلم/٥٧٩ وە ئیمـامی أبـو داود/٩٨٨ وە ئیمـامی نسـائی بـەرگی ٣٠٨/٢ وە ئیمامی إبن خزیمـە/٧١٨ وە أبـو عوانـە لـە موسـنەدی خـۆی بـەرگی ٢٢١/٢–٢٢٢ وە ٢٢٦ وەئیمـامی بەیهـەقی بـەرگی ١٣٠/٢–١٣١ ریوایـەت دەکەن لە عامر بن عبـدالله بـن الزبـیر دەگێڕێتـەوە کـە دەفەرمووێ (پێغەمبەر ﷺ کاتێ دەئەنیشت لـە نوێـژ پێـی چەپـەی لـە نێـوان رانو قـاچی دائـەنا، وە پێـی راستەی رائەخست، وە دەستی چەپەی لەسەر ئەژنۆی چەپی دائەنا وە دەستی راستی لەسـەر رانـی راستەی

دائەناو ئاماژەی بە پەنجەی ئەکرد).

وە ئـەم حەدیسـە ئیمـامی أبـو داود/٩٨٩ وە ئیمـامی نسـائی بـەرگی٣/٣٧ وأبـو عوانـە لـە بەرگی٢/٢٢٦ وەئیمامی بەیهـەقی لـە بـەرگی٢/١٣١ ریوایەت دەکەن لە چەند رێگایەك لە حجـاج بـن محمـد الأعور دەگێڕێتەوە لە إبن جریـج ئـەویش دەگێڕێتـەوە لە زیـاد بـن سـعد ئـەویش دەگێڕێتـەوە لـە عبـدالله بـن الزبیر کە پێغەمبەر ﷺ(کان یشیر بأصبعه إذا دعـا ولا یحرکها) واتە: ئاماژەی بە پەنجەی خۆی دەکـرد کاتـێ دوعـای ئـەکرد وە نـەیدەجوولاند ئەمـەش ئیسـنادێکی (حسـن)ە، وە إبـن جریـج بەڕاشـکاوی فەرمووییـەتی بـەوەی کـە زیـاد بـن سـعد قسـەی لەگـەڵ کـردووە لـە ریوایەتی (أبو عوانه والنسائی والبیهقی) وئیمـامی أبـو عوانە ئەم حەدیسەی داناوە لە ژێر ناونیشـانی (باسـی

ئامـاژە کـردن بـە پەنجـەی شـادە بـۆ لای قیبلـەو تەماشاکردنیو وازهێنان لە جوولاندنی).

وە حەدیسـی (أبي حميد السـاعدي) ئیمـامي ترمذی/٢٩٣ ریوایەت کردووەو دەفەرمووێ: (بندار بـن محمد بـن بشـار) پێـی گوتـین أبـو عـامر العقدی پێـی گوتین فلیح بن سلیمان المدنی پێـی گوتـین عبـاس بـن سهل الساعدی فەرمووی: (أبو حمیدو أبو أسیدو سـهل بن سعدو محمد بـن مسـلمه) کۆبونـەوەو باسـی نوێـژی پێغەمبـەریان ﷺ کـرد، أبـو حمیـد فـەرمووی: مـن لـە هـەمووتان شـارەزاترم لـە نوێـژی پێغەمبـەر ﷺ، کـە دائەنیشـت- واتـە بـۆ تـەحیات- پێـی چەپـەی رائەخستو پێشەوەی پێی راستەی رووی ئـەکردە لای قیبلـە وە دەسـتی راسـتەی لەسـەر ئـەژنۆی راسـتی دائەناو دەستی چەپی لەسـەر ئـەژنۆی چـەپی دائـەناو

ئامائەی بە پەنجەی ئەکرد- واتە پەنجەی شادە-ئەمەش (صحیح لغیره)یە[٢٣].

وە حەدیسی نمیر الخزاعي ئیمامی أبو داود/٩٩١ وە ئیمامی نەسائی لەبەرگی ٣/٣٩ وە ئیمامی أبن خزیمة / ٧١٥ و ٧١٦ وە ئیمامی بەیهەقی لەبەرگی ١٣١/٢ ڕوایەتیان کردوە لە عصام بن قدامة الجدلي دەفەرمووێ مالك بن نمیر الخزاعي کە خەلکی بەصرەیە پێی وتم کە باوکی پێی وت کە پێغەمبەری

(١) لەم لێکۆڵینەوە وردەو بەدوا کەوتنە قووڵە، بۆمان دەرکەوت کە قسەی لێکۆڵەرەوەی نامیلکەی (الحافظ إبن رجب) کە ناوی (الخشوع في الصلاة)ە چاپی یەکەم/ دار عمار/ ١٤٠٦ك قسەکانی هیچیان تەواو نین‌و ڕاست نین، بە تایبەتی لە لاپەڕە٧ دەڵێ: عبدالعظیم آبادي لە کتێبی (عون المعبود) بەرگی ٣٧٤/١، دەفەرمووێ لەمەدا دەردەکەوێ کە بەردەوام پەنجەی بجوڵێ. تەواو بوو قسەکانی لێکۆڵەرەوەکە. بەڵام ڕاستی‌یەکەی ئەوەیە کە عبدالعظیم آبادي لە دوای ئەمە لە بەرگی ٢٨١/٣ دەفەرمووێ: بەڵام مەبەست بە جوولاندن لێرە تەنیا بەرز کردنەوەیە هیچی تر نا. تەواو بوو قسەکانی ئەم زانایە بەمەش دەقی دووەم دەقی یەکەمی سڕی‌یەوەو بەمەش عبدالعظیم آبادي جوولاندنی پەنجەی نەفی کردووە وەکو زانایانی حەدیس.

بینی به دانیشتوویی له نوێـژ، دەسـتی ڕاسـتەی لەسەر ڕانی ڕاستەی دانابوو و پەنجەی شەهادەی بەرز کردبۆوەو کەمێك خـــواری کردبـــوو دوعـــای دەکـــرد. ئەمەش (حديث حسن في الشواهد).

## ئاگاداری دەربارەی مانای ئەلقەکردنی پەنجە

چەند کەسێك وا تێگەیشتوون کـە ئەڵقـە کردنـی پەنجـە ئەوەیـە کـە پەنجـــەی شـــەهادە وەکـــو بازنـــە بجوولێنی، بەڵام ئەوە وا نیـــە، بـەڵکو ئەلقـە کـردن لـە نوێـژ ئەوەیـە کـە نوێژکـەر پەنجـەی نـاوەندو پەنجـەی گـەورە بـە شـێوەی ئەلقـــە لێ بکـات، وە ئامـــاژە بـــە پەنجەی شـــەهادە بکـــا، ئەمـــەش بـــە هیـــچ جۆرێـــك جووڵاندنی لێ نافامرێتەوە.

وە ئەمەش بە ڕوونی هاتوەلە حەدیسی صەحیح، ئەوەتا ئیمامی ئەحمەد لە موسنەدی خۆی بەرگی ٢١٦/٤ وە ئیمامی أبن خزيمة/ ٦٩٧ ڕوایەت ئەکەن لە حەزرەتی (وائل بن حجر) ڕەزای خوای لێ بێ دەفەرمووێ ( رأيت النبي ﷺ قد حلق الابهام الوسطى ورفع التي تليهما يدعو بها في التشهد) واتە پێغەمبەرم بینی ﷺ پەنجەی ناوەندو پەنجەی گەورەی وەکو ئەلقەی لێ کردبوو و ئەو پەنجەیەی لە دوایان دێ بەرزی کردبوو دوعای پێ دەکرد لە تەحیات.

وە ئیمامی نەسائی لە بەرگی٣/ ٣٥-٣٦ ڕیوایەتی کردوە بەم وشانە( وقبض ثنتين وحلق ورأيته يقول هكذا وأشارت بالسبابة من اليمنىو حلق الابهام والوسطى) واتە وە دوو پەنجەی نوقاندو ئەلقەی کردو و بینینم ئاوای کرد: ئامارەی بە پەنجەی

شـەهادەی دەسـتی ڕاسـتی کـرد و پـەنجـەی گـەورەو پەنجەی ناوەندی  وەکـو ئـەلقـە لێکـرد. جائاگـادار بـە.



ئەمەیـە ئـەوەی لـە توانـام دابـوو بەشـێوەیەکی کـورتو پـوخـت دەربـارەی پـەنجـە جوولاندمـان هێنـا وەڕوونکردنەوەی ئەوەی کە مەکرووهە بیجوولێنی، بـە تایبەتی ئەگەر بزانین کە شەرعزانە شافعی‌یەکان ڕایان لەسەر ئەوەیە کە جولاندنی پـەنجـە مەکرووهـە لـە نـاو نوێژ مەگەر بۆ شتێکی پێویست نـەبێ وەکـو خورانـدی جێگایەك و شێوەی ئـەو. جـا بـە جوانـی سـەیری ئـەم نووسینە بکەو جوان بیری لێ بکـەوە لـە خـوای گـەورە داواکارین کە کۆتایی ژیانمان بە خێر بێنێ.

وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين.

نووسەرەکەی ( حسن بن علي السقاف) دەڵێ
تەواو بووم لەم نوسینە لە شەوی ١٥/شەوالی ١٤٠٨ لە
کۆچ کردنی گەورەو سەروەرمان (محمد المصطفى
ﷺ) جگە لە هەندێ شتی زیادەکراو لەچەند کاتێکی
جیاجیا.

وتم: منیش بەندەی بێ چارەو پێویست بە
رەحمەتی خوا (عبدالشهيد عثمان) سوپاسی خوا
دەکەم کەیارمەتی دام بۆ وەرگێڕانی ئەم نامیلکەیە لە
ڕۆژی ١١/ ڕەجەب ١٤٢٠ی کۆچی.

وآخر دعوانا ان الحمد لله رب العالمين.